خان، هیودارم لێی تێبگەیت، یاسا لەوەش جوانو رێکوپێکتر نابێت، ئەوەتا مەسەلەکەی لە هەموو لایەکەوە رەچاو کردووەو بە وردیی چارەسەی کردووە، ئیتر نازانم ئێوە بۆ چ رائەکەن لێی؟ لەسەر چ بنەرەتێك رەخنە دائەرێژن، ئەی بۆچی شەیدای بیرو راو باو و رارەوی خۆرئاوابوون و خەوی پێوە ئەبینن، بەبێئەوەی شارەزای بن؟!

گوێ بگرن لە یەکێکی وەك پۆلس، کە یەکێکە لە ئەستێرەکانی ئاسمانی بیروڕای خۆرئاواو ئێوەش خۆرئاوا بە بەهەشتی بەرین ئەژمێرن، ئەڵێت: "من ئەمەوێ هەموو خەڵك وەك من بێت . واتە زگورتی بێت . بە زگورتەکان بە نێرو مێیانەوە ئەڵێم وا چاکە بۆیان وەك من بمێننەوە". کەچی هیچکام لە ئێوەو ئێوەمانان پەنجەیەکی رەخنەی بۆ راناکێشێ، هەر باسیشی ناکات، بەڵام ئیسلام بەو یاسا پاکە خواییەوە، بەو بەرنامە جوانە بێهاوتایەوە، بەو وردەکاریی فراوانییەوە، هەزارەها رەخنەی بێجێی لەلایەن رۆڵەکانی خۆیەوە بە کوێرانە لێئەگیرێت! توانجی ناهەقی تێئەگیرێت، درۆو ساختەی بۆ ئەتاشرێت، نەك بەشێوەیەکی زانیارییانە، بەڵکو بە کوێرانەو هەر وا بە هەرەمەکیی، ئای کە ئەوەش تاوانو ستەمە!

سکاڵا: خوا یاربێت، بەچکە مسوڵمانان، بە تایبەتیی چینی ئافرەت، بیر ئەکەنەوە، بەڵام بیرکردنەوەش پێویستی بە بیرخەرەوە هەیە، ئادەمیزاد بەسرووشت راستیی خۆش ئەوێت، بەڵام دۆزینەوەکەی کارێکی سووكو ئاسان نییە.

خۆر بەورشەوە هەر کاتێ هەڵهات دودی قەنیلە خەڵك چی لێئەکات؟

جوان: خۆزگەم بە خۆت دڵپاك خان، خۆزگەم بەو رۆژەی کە تێئەگەم.

## نەنگیەکە لە خۆتایە

هەڵکەوت: لێرەدا شتێك دێتەکایەوە، مامۆستا دڵپاك، گوێگر لە باسەکەدا، سەبارەت بە رای ئیسلام لە بارەی پەیوەندیی نێوان ئافرەتو پیاوەوە، دوودڵیی دای ئەگرێت، لە لایەکەوە هاندانێکی زۆرو زەبەندە بۆ هاوسەریی، لە لایەکی ترەوە نەفرەت کردن لە لەزەتپەرستیی، ئادەمیزاد نازانێ روو بکاتە کام لایان؟

دڵپاك: هەڵوێستی ئیسلام لە مەسەکەدا زۆر ئاشکراو روونەو زۆریش لە دوودڵییەوە دوورە، بەڵام خراپ بۆچوونی خۆت سەری لێشێواندنوویتو ئەنجامەکەی لێشاردوویتەوە، بەبێئەوەی هەست بەو سەرلێشێوانە لە خۆتا بکەیت، بۆیە ئەیخەیتە ئەستۆی ئیسلام.

برای شیرینم، تۆ هاوسەریی بە لەزەتپەرستییەکی رووت ئەژمێری، کەچی لە راستییدا لەزەتپەرستییەکی رووت نییە، هەروەها تەنها دوولایەنی (افراط و تفریط) زیادەرەویو کەمرەوی لە مێشکتا جێیان بۆتەوە، کەچی لایەنی سێیەم کە مام ناوەندێتییە بە بیرتا نایەت. ئەمجا ئەگەر قایل ببیت . لەگەڵ رێزمدا بۆت. نەنگەکە لە خۆتانە.

ئایینی ئیسلام ئاینێکی مامناوەندییە، خوا ئەفەرموێ: (وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطاً لِّتَكُونُواْ شُهَدَاء عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيداً..) (البقره: 143)، جا لەبەر ئەوە لە هیچ شتێکدا ئیسلام نە زیادەرەوییو نە کەمرەویی بەلاوە پەسەند نییەو باری مامناوەندێتیی بەلاوە راستە، تەنانەت لە پەرستشا کە کاکڵەو گیانی ئیسلامە، لە یەکەمین ئایەتی سورەتی (طه)دا خوا بە پێغەمبەر، بەهۆی زۆری پەرستشیەوە ئەفەرمووێ: (طه *مَا أَنزَلْنَا عَلَيْكَ الْقُرْآنَ لِتَشْقَى) (طه: 1 ـ 2). بەراستی دوو لایەنی زیادەرەوییو کەمرەویی هەردووکیان ماندووبوونو زەحمەتکێشانیان تیایە.

عازەبییو زگورتیی کەموکورییو لەزەتپەرستی زیادەرەوییە، لەبەرئەوە هیچ کامیان بە چاكو راست نازانرێن لە ئیسلامدا، ئەی بۆ چ لایەنی مامناوەندیی نەگرین؟ بڤەیەو ئەمانخوات؟! دنیا وێران ئەبێ؟! ئەی زۆرخۆریی ناساغیی بەدەمەوە نییە؟ بۆ چی ئەبێ یان نەخۆر، یان زۆر خۆر بین؟!

شتێکی تری گرنگ هەیە کە یاسا دانراوەکان، یان پەییان پێنەبردووە، یاخود تەنها پەییان بە کەمێکی بردووە، ئەویش ئەمەیە: ئیسلام لە هاوسەرییدا دوو لایەن لە ئادەمیزاددا رەچاو ئەکات، ئاژەڵییو لایەنی ئینسانیی.

ئاواز: ئەی ئیسلام ناڵێت ئادەمیزاد ئاژەڵ نییەو ئادەمیزادە؟ ئیتر لایەنی ئاژەڵیی یانی چی؟ فەرموو، ئەوەم پێبڵێ؟

دڵپاك: من نەمگوت ئادەمیزاد ئاژەڵە، قسەکە هەڵمەگێڕەوە، بەڵکو گوتم، ئادەمیزاد لایەنی ئاژەڵیی تیایە، یانی لە هەندێ ڕووەوە یەکئەگرنەوە، ئەی نابینی ئاژەڵ‌و ئادەمیزاد، خۆراك ئەخۆن، پێویستیان بە هەناسەدان هەیە، پەڕینو زاوزێیان هەیە، کۆتایی بە ژیان ـ تەمەن ـیان دێت.. هتد، جا ئێمە باسەکەمان لە ڕووی هاوسەریی‌و زیاتر ـ جنس ـ ەوەیە، یاسای ژمارە (11)ی سورەتی (الشوری) ئەفەرموێت: (..جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجاً وَمِنَ الْأَنْعَامِ أَزْوَاجاً يَذْرَؤُكُمْ فِيهِ..). لێرەدا ئادەمیزادو ئاژەڵ وەك یەك لە جووتان (أزواج) خەلق کراون، هیچ جیاوازییەکیان لەم ڕووەوە لە نێواندا نییە.

نەشمین: چۆن؟ من ئەمەیانم بەلاوە هەر زۆر سەیرە!

دڵپاك: نەخێر، هیچ سەیرێکی تێدانییە، چونکە لەم لایەنی یەککگرتنەدا ـ لەنێوان ئاژەڵ‌و ئادەمیزاددا ـ مەبەستو ئامانج هاوبەشە، ئەها ئایەتەکە خۆی دەربڕیوە (يَذْرَؤُكُمْ فِيهِ)، واتە چ مرۆڤو چ ئاژەڵ بەهۆی پەیوەندیی جنسییەوە، هەریەکە لەگەڵ هاوڕەگەزەکەی خۆیا، زنجیرەی تۆوو وەچەی جۆرەکەی خۆی ئەهێڵێتەوەو ناهێڵێ جۆرەکەی بەسەر بچێت‌و بڕێتەوە، ئەمەش یاساو سوننەتی خوایە: (وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلاً). دەی لەم لایەنەدا کە لایەنێکی ئاژەڵیی ڕووتە، کە مەبەست هێشتنەوەو بەردەوامبوونی جۆرو نەسلە لە هەردووکیاندا، ئەبینی ئادەمیزادو ئاژەڵ تیایا یەکئەگرنەوە، ئەمەیە لایەنی ئاژەڵیی کە باسمکرد بۆتان، ئایا ئەوە پێویستیی بە هیچ جۆرە سەرسوڕمانێك هەیە؟

جوان: ئێمە هەرچی لە ڕووی ئیسلامەوە ئەبیسین، سەرمان سوڕئەمێنێ.. ئەی.

دڵپاك: بەڵام ئادەمیزاد لەلایەنی دووەمدا ـ ئینسانیی ـ لە ئاژەڵ جیا ئەبێتەوە، واتە ئەمەیان لایەنێکی ئادەمیزادانەی ڕووتە، گوێ بگرن لە یاسای ژمارە (223)ی سورەتی (البقرة) (نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ). لێرەدا ڕووی لە ئادەمیزاد کردووە بەبێ ئاژەڵ، پیاو دائەنێت بە جوتیارو ئافرەتیش بە زەویی، پیاو تۆو ئەوەشێنی بە زەویدا، دیارە جوتیار کە تۆوی وەشاند، نابێ بڕوات‌و بەجێی بهێڵێ‌و ئیتر لێی نەپرسێتەوە، بەڵکو ئەبێ ئاوی بدات، پەینی بۆ بەرێ، پاچەکۆڵەو بژاری بکات، پەروەردەو ئاگاداریی بکات، بیپارێزێت، پێوەی خەریك بێت، تا پێئەگات، ئەوەش بۆ زەوییەکەو تۆوەکە وەك یەك پێویستە، ئایا لێرەدا مرۆڤ لە ئاژەڵ جیا نابێتەوە؟

سکاڵا: بەڵێ جیا ئەبێتەوە، چونکە بەخێوکردنی مناڵ لە ئەستۆی دایك‌و باوکدایە.

دڵپاك: نەك لە ئەستۆی دایکدایە بە تەنها، ئەوەتا لە ئاژەڵەکاندا ـ بەزۆریی ـ ئەو کارە هی دایکە بە تەنیا، بەڵام لەو شوێنانەدا کە بەرەڵڵایی پەڕیینی تێدا بڵاوبۆتەوەو کارەکە تەنها بە تۆو فڕێدان‌و وەرگرتن ئەژمێرن، بەزۆریی بەخێوکردنی مناڵ هی ئافرەتە، چونکە دایك ناسراوە، بەڵام باوك نەناسراوە، ئایا ئەوەش گەڕانەوە بەرەو ئاژەڵێتیی، یان ناوی شارستانییەتی لێ بنێین؟

سەبارەت بە جووت (الأزواج)ی ئاژەڵ قورئان درێژەی پێنەداوە، بەڵام بۆ ئادەمیزاد ئەفەرموێ (وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً)، (هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ). بە ڕوونیی ئەبینین حیساب بۆ گیان‌و دەروونی ئادەمیزاد کراوەو ئەبێت پەیوەندییەکی گیانیی قووڵ بیانبەستێ بە یەکەوە بۆ هاریکاریی کردن لە بەڕێوەبردنی ژیاندا، لە خۆشویستنی بەچکەکانیاندا، کە لەوەیشەوە پەیوەندیی نێوان ئەندامانی خێزان هەڵدەقوڵێت، لەو خێزانانەش کۆمەڵ‌و کۆمەڵگە دروست ئەبێت، بە دروستبوونی ئەوانیش شارستانییەت پێکدێت، دەی کەی ئەم شتانە لە ئاژەڵدا هەن؟ ئەها ئاژەڵەکانی تر لەبەر نەبوونی ئەوانەی باسمان کردن شارستانییەتیان نییە!، بیرتان لەمە کردۆتەوە؟ ئایا ئەو سۆزو خۆشەویستییەی لە نێوان جووتانی ئادەمیزاددا هەیە، لەناو هی ئاژەڵیشا هەیە؟، ئەو هاریکارییەی لە نێوان ژن‌و مێرددا هەیە، لە نێوان جووتی ئاژەڵیشا هەیە، یان شتێکی ترە کۆیان ئەکاتەوە؟[1].

1 بۆ ئەم باسە، بە درێژی تەماشای (الحجاب)ی مودودیو (الاسلام وقضايا المرأة العاصرة)ی البهي الخولي بکە.

سەربەست: ئاژەڵ ئارەزوو (غریزة) کۆی ئەکاتەوە، نەك شتێکی تر.

پرشنگ: ئاخر ئادەمیزاد، خوا عەقڵی پێبەخشیوەو خاوەنی بیرو سەرنجە.

دڵپاك: ئەوە ڕاستە، دەی ئەبێ ئادەمیزادیش ئەو عەقڵەی بخاتە کارو چاك و خراپی پێبناسێنیو دوای چاك بکەوێت و خۆی لە خراپ دوور بگرێت، جا نازانم خوشکە ئاواز ئێستا لایەنی ئاژەڵیی و لایەنی ئینسانیی لە ئادەمیزاددا بۆ ساغ بۆوە؟

ئاواز: بەڵێ بۆم ساغ بۆوە.

مام جەمیل: بەخوا ڕۆڵە ئەوەندە باسەکانتانم بەلاوە جوانە، دڵم نایەت بەجێتان بهێڵم، لەگەڵ ئەوەشدا گەلێ ئیشوکارم هەیە.

# بەشی چوارەم

## پڕ لەکەڵك و حیكمەتە

نەشمین: مامۆستا دڵپاك، بەڵێ زانیمان كە ئیسلام لەزەتپەرستیی ناوێ، ژیانی زگورتیی و عازەبیی و گۆشەگیریشی بەلاوە ناڕەوایە، بە گەرمیش داوا ئەكات كە پیاو ژن بهێنێ و ئافرەتیش شوو بكات، پێم ناڵێیت بۆچی ئەوەندە بایەخی بە مەسەلەی هاوسەریی داوە؟ بۆچی ئەوەندە گرنگیی پێئەدات؟

سكالاّ: توخوا تۆ خۆت قایل بوویت بە قسەكانی پێش پرسیارەكەت؟

نەشمین: بەڵێ قایل بووم، لە ڕاستییدا لەمەوپێش نەمزانیوە كە ئیسلام ئەم باسەی بەم وردیی و قوڵییە كردووە، لە كەسم نەبیستووە.

دڵپاك: خوشكێ گیان. مسوڵمان ئەبێ ئەوە بزانێت و دڵنیابێت كە فەرمانی خواو پێغەمبەر ﷺ هەڕەمەكیی نییە، بەڵكو پڕە لە حیكمەت و كەڵك و قازانج بۆ ئەوانەی كە پەیڕەویی ئەكەن، ئەی ئیسلام بەرنامەی خوای پەروەردگارمان نییە؟.

هاوسەریی وەك باسمان كرد ئەبێتە هۆی نەهێشتنی عازەبیی و ژیانی زگورتێتیی، چوونە بەدەم ئارەزووی سرووشتیی ئادەمیزادەوە بە ڕێگەیەكی پاكی ڕەوا، ئارامبوونەوەی لاشەیی و دەروونیی ئافرەت و پیاوە، سەربەستیی و سەربەخۆیی پاراستنە، دروستكردنی پەیوەندیی پاك و نزیكبوونەوەی خەڵكە لە یەكتر لە شێوەی خزمایەتییدا، سازاندنی هێزو یەكێتییە، دروستبوونی خێزانە، كە هێلانەی پرشنگداری خۆشەویستیی و بەزەیی پیاهاتنەوەو خۆنەویستیی لێئەبێتەوە، گرنگترین ڕێگەیە بۆ هێشتنەوەی نیشتەجێیی و بێگەردیی و ئابڕوو شەرەف و ڕێزی ئادەمیزاد. یاسایەكە پاراستنی تۆوو نەسل و قەرەچۆڵی مرۆڤایەتیی پێوە بەندە.

ئیسلام ئەوانەو چەندەها كەڵك و حیكمەتی تری ڕەچاوكردووە، ئەی ئیتر بۆچی بایەخ و گرنگی نەدا بەهاوسەریی؟ ئایا پشتهەڵكردن لە هاوسەریی پشتهەڵكردن نییە لەو هەموو كەڵك و حیكمەتانە؟، ئایا ڕاستە لەبەر ئارەزوو، سوودو كەڵكی هەوەسبازیی خۆمان، بەرژەوەندیی تاك و كۆمەڵ بخەینە ژێرپێمانەوە؟.

سەربەست: كورە بەشەرەفم ڕاست ئەكەیت، بەشەرەفم خەڵك ئەگەر بێتو ئیش و شتی پیس دەست بدات بۆی، هەرگیز بیر لە هاوسەریی ناكاتەوە.

جوان: بەڵام من كەڵكەكانی هاوسەرییم بە باشی بۆ ڕۆشن نەبوونەوە، حەز ئەكەم كەمێ چاكتر باس بكرێن.

## كەڵكەكانی هاوسەریی

### 1- پاراستنی جۆری مرۆڤایەتی (المحافظة على النوع الانساني)

دڵپاك: یەكێك لە سەلمێنراوەكانە كە هاوسەریی ڕێگەی زۆركردنی نەسل و وەچەی جۆری مرۆڤەو پایەی سەرەكیی مانەوەو بەردەوامبوونیەتی لەسەر زەویدا.

هەمووومان ئەزانین، ئادەمیزاد وەك دانەوێڵە نییە كە لە وەرزێكی تایبەتییدا یەك كەس زەوییەكی فراوان بكێڵێت و بەشی ناوچەیەك تۆوی تێدا بچێنێت.

وەك ڕووەكەكانی تر نییە بە نەمام و قەڵەم و كەوش گرتن و .. هتد زۆر بكرێت، وەك هەندێ زیندەوەری یەك خانە

نییە، بەرێگەی لەتبوون زۆر بێت، نەخێر ئەم تەنها لە رێگەی لە دایکبوونەوە زۆر ئەبێت، دەی هاوسەریی لە نێوان پیاوو ئافرەتدا پاکترین شێوەیە بۆ ئەو مەبەستە.

**2- پاراستنی بنەچە (المحافظة على الأنساب)**

دڵپاك: بەو هاوسەرییەی کە خوا بۆی دیاری کردووین، ئادەمیزاد بنەچەی خۆی ئەناسێتو شانازیی ئەکات بە باوكو دایكو کەسوکارییەوە، خۆی بە تەنیاو بێکەسو نەزانراو نازانێت، هەست بە خودو کەرامەت ئەکات، هەست بە پشتگیریی و سۆزو نازی کەسانێتر ئەکات کە نواندوویانەو ئەی نوێنن بەرامبەری، ئەویش ئەو سیفەتە جوانانەی تێدا نەخش ئەبێت، ئەوەش یەکێکە لەو پایانەی کە بەختیاریی ئادەمیزادی لەسەر بەندە.

باجی عائیشە: بەخوا کچم راست ئەکەی وایە، بێکەسیی هەر بۆ خوا باشە.

**3- پاراستنی کۆمەڵگە لە بەدڕەوشتیی**

دڵپاك: بە هاوسەریی کۆمەڵگە لە بەدڕەوشتیی ئەپارێزرێت، کەسان لە فەسادی کۆمەڵایەتیی سەلامەت ئەبن، چونکە بە هاوسەریی تاسەو هەوەسی پەڕیین تێر ئەکرێت، ئاگرو خارۆشی لەشو دەروون دائەمرکێتەوە، ئای کە پێغەمبەر ﷺچاکی پێکا، کاتێ داوا لە گەنجان ئەکات کە هاوسەریی بگرنەبەر!! (یامعشر الشباب من استطاع منكم الباءة فليتزوج، فانه اغض للبصر، واحصن للفرج..) رواه الجماعة.

**4- هاوکاریی ژنو مێرد بۆ پێکەوەنانی خێزانو پەروەردەکردنی منداڵان**

دڵپاك: بە هاوسەریی، ژنو مێرد هاوکاریی یەکتر لە پێکەوەنانی خێزاندا ئەکەن، دەی ئەگەر هەر پەڕیین بێ خۆ لە ئاوەسیشا جێبەجێ ئەکرێت، خێزان منداڵیشی تێدا ئەبێت، ئەوسا ژنو مێرد بەخێوی ئەکەن، بەڵام ئایا لکانێکی سەرەڕێیی نارەوا ئەو بەخێوکردنو پەروەردەکردنە ئەگرێتە خۆی؟، کەچی دایكو باوك لە خێزاندا هەریەکەیان لە کایەی خۆیا ئیشوکاری خۆی رائەپەڕێنێ، ئافرەت لە چوارچێوەی پسپۆڕیی و تایبەتمەندیی خۆیا کە لەگەڵ سرووشتیدا بگونجێ و پیاویش لە لە چوارچێوەی پسپۆڕیی و تایبەتمەندی خۆیدا.

بەو جۆرە گیانی هاوکاریی لە نێوان ژنو مێرددا نەك هەر هەیە، بەڵکو هەمیشە گەرمو بەجۆشە، خێزانیش لەسەر بنەڕەتی پەروەردەیەکی پاكو چاكو راست لقو پۆپ دەکات، ماڵ هەمیشە بۆنی سۆزو بەزەیی و خۆشەویستیی و دڵسۆزیی و هاوکارییکردنی لێدێت. ئایا ئەمە بە پەڕینێکی رووتی ئاژەڵ ئاسای سەرەڕێگا دێتە دی؟ (وَاللّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجاً وَجَعَلَ لَكُم مِّنْ أَزْوَاجِكُم بَنِينَ وَحَفَدَةً..) (النحل: 72).

**5- پاراستنی کۆمەڵگە لە نەخۆشیی**

دڵپاك: بەهۆی هاوسەرییەوە، کۆمەڵگە لە دەردە درمەکان قوتار ئەبێت، کە ئەو دەردو نەخۆشییە کوشندانە لە رێگەی شەڕواڵ پیسییەوە بڵاو ئەبنەوە، سیلان، زوهەریی، تەقەڕووحاتی جنسیی، القرح اللين، مرض النضج الجنسي المبكر.. هتد. ئایا هەموویان لە ئەنجامی بەرەڵڵایی پەڕیینەوە تەشەنە ناکەن؟،

ئەی بۆچی لەو شوێنانەدا کە هاوسەریی رەوای تێدا ئەکرێت زۆر کەم ئەو دەردانە بەدی ئەکرێت؟، ئایا دوورخستنەوەی کۆمەڵگە لەو دەردانەن لە نەزۆکیی، لە شێواندنی لەشو لاری ئادەمیزاد کارێکی کەمە؟.

مام جەمیل: یاخوا ئەو نەخۆشییانە روو نەکەنە هیچ لایەك، ئای کە پیسن !

**6- ئارامیی و هۆگریی گیانو دەروون**

دڵپاك: بەهۆی ژنهێنانو شووکردنەوە پەیوەندیی خۆشەویستیی و سۆزبەخشیی ئەکەوێتە نێوان ژنو مێردەوە، هۆگریی یەکتر ئەبن، چونکە هەریەکەیان ئارامیی و بەختیاری خۆی لەژێر سایەی ئەویتردا بەدی ئەکات.

مێرد کە دەست لە کاری رۆژانەی هەڵئەگرێت، دەمەو ئێوارە بەرەو ماڵەوە ئەکەوێتە رێ، لەگەڵ ژنو منداڵەکانیدا کۆئەبێتەوە، هەرچی ئەزیەتێك، غەمو ئەشکەنجەو پەژایەکی هەیەو بە درێژایی رۆژ کۆبۆتەوە لەلای، لە بیری ئەچێتەوە، ئافرەتیش هەر بەو جۆرە.

بەو جۆرە هەریەکە لە ژن و مێردن لە سایەی یەکتردا ئارامیی و هۆگری خۆی دەست ئەکەوێت، هەست بە دڵنیایی و شادمانیی بە هۆی یەکترەوە ئەکەن، ڕۆژی داهاتوو هەریەکەیان بە دڵێکی پڕ لە هێزو تینەوە، بە چالاکیی و سنگی فراوانەوە، پێشوازی ژیان ئەکاتەوە، ئەو ئەرکەی کە لە ئەستۆیدایە بەجێی ئەهێنێ. (وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجاً لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً..) (الروم: 21). ئایا ئەوەی کە گوتمان، لە نێوان دوو (دڵدار)ی لەزەتپەرستدا بەدی دێت؟ ئەی چی تری بە کەڵک چاوەڕوان ئەکرێ کە ڕوودات لە نێوان دوو کەسدا کە ساتێك ئالۆش و خارۆش لە لەشدا نەك لە گیان و دەروونداکۆیان بکاتەوە؟ ئایا پاش بەسەربردنیی ئارەزووە لاشەییەکە هەریەکەیان بچێت بەلایەکدا؟ هێمنیی و ئارامیی دەروون و گیان ڕوویان تێئەکات؟ لە خۆشیی و ناخۆشییدا بە شداریی یەکتر ئەکەن؟

باجی عائیشە: جا ئەگەر تەماشای گیاندارەکانی تر بکەین، بەم باسەمان بۆ ساغ ئەبێتەوە، ئەی ئەوە نییە دوای پەڕینەکەیان هەریەکەیان بەلایەکدا ئەڕوات؟

## 7- ڕاچڵەکاندنیی سۆزیی دایکێتیی و باوکێتیی

دڵپاك: دیسانەوە بە هاوسەریی سۆزی دایکێتیی و باوکێتیی، لە ناخی ئادەمیزاددا بە جۆشەوە ڕائەچڵەکێت، هەست و نەست بەرامبەر جگەرگۆشەکان وەکو خونچە ئەکرێتەوەو بۆنی پرش و بڵاو ئەکاتەوە، هەموو فامیدەیەك ئەزانێ ئەو سۆزە چۆن پاڵ بەدایك و باوکەوە دەنێت کە تێبکۆشن بۆ پێگەیاندن و دەستگرتنی جگەرگۆشەکانیان و بۆ ڕووپێ نانیان بەرەو ژیانێکی پڕ لە کارامەیی، بەرەو دواڕۆژێکی پرشنگدار، بەرەو شێوازو ڕەفتاری پاکی مرڤانە.

ئەبێ ئەوەش بزانین، ئەو سۆزی دایکێتیی و باوکێتییە، ئادەمیزاد فێری چاکیی و دڵسۆزی لە کارکردن و بەرهەمهێناندا، ئەکات، فێری هەستکردن بە بەرپرسیاریی ئەکات[1].

هەڵکەوت: لەو ئاماژەکردنەدا بە بەرپرسیاریی مەبەستت چییە؟

دڵپاك: ئەو کەسەی کە زگورتە، خێزانی بەسەرەوە نییە، ئەڵێ: "من پەکم ناکەوێ، هەر خۆمم بە تەنیا هەر چۆن بێت ئەتوانم خۆم بژێنم، جا بۆچی خۆم سەغڵەت بکەم، بۆ چی خۆم ماندوو بکەم؟ بۆ کێی بکەم، بۆچی بەجێی بهێڵم بۆ خەڵك؟". لەبەر ئەوەش لە کارەکەیدا تینو گوڕ ناداتە خۆی، چونکە نایەوێ هیچی لەدوا بەجێ بمێنێ، بەڵام بە پێچەوانەوە، خاوەن خێزان و منداڵ ئیشوکاری خۆی بە چالاکانە بە جێئەهێنێ، تینو گوڕ ئەداتە خۆی، درێغیی ناکات، زۆر هەوڵ ئەدات، چونکە ئەڵێت: "تا خۆم ئەژیم بەشدارم لە بەرهەمی کارەکەما، کە خۆم نەمام بۆ جگەرگۆشەکانم، ئەی پارچەیەك نین لە جگەرم؟ ئەی ئەوانە درێژبوونەوەی ناونیشانی من نین؟ .. هتد".

ئایا مافی خۆی نییە کە ئیسلام ئەوەندە بایەخی بە مەسەلەی هاوسەریی داوە؟ ئایا پڕ نییە لە پەندو کەڵك و حیکمەت؟ جا ئاخ بۆ ئەو کەسانەی کە لە پەندو کەڵك و حیکمەت ئەزانن و تێئەگەن.

نەشمین: بە ڕاستی مامۆستا دڵپاك، ئەزیەتی زۆرمان دایت و گەلێ ماندوومان کردیت، لێمان ببوورە، بەخوا ئێمە تەنیا لە دەفتەرنفووس و جنسییەدا بە مسوڵمان دانراوین، ئەگینا فرمان بە ئیسلامەوە نییەو لێی نازانین.

دڵپاك: ئەوەی کە ددانت پیادا نا، ئینشائەڵڵاخێرە، هەنگاوێکی گرنگە بۆ وریابوونەوە، هەستکردنە بە تەنگ و چەڵەمە، جوڵاندنی بە دەمەوە ئەبێ، تا هەست بە برسێتیی نەکەیت، هەوڵی خۆراك ئەدەیت؟

بەهار: بابەگیان، جلی مسوڵمانانە بکرە بۆ من و نازدار، با ئیتر لە مەولا جلی مسوڵمانانە بپۆشین.

مام جەمیل: ئەی بەسەر چاو، ئەی ئافەرین کچە ژیرەکەم.

[1] کەڵکم لە (عقبات الزواج)ی عەبدوڵڵا علوان و (المرأە المعاصر)ی البهی الخولی وەرگرتووە.

# ئۆقرەو ئارامگە، نەك كارەكەرو خزمەتكار

پرشنگ: من ئێستا زۆرچاك ئەزانمو بۆم دەركەوت كە ئیسلام هانی پیاو ئەدات بۆ ژنهێنانو هانی ژن ئەدات بۆ شووكردن، بەڵام شووكردن ژن ئەكاتە خزمەتكارو ئەبێتە كارەكەر، ئەم چەرخەش هی سەربەستییە، نەك خزمەتكارییو كارەكەرێتیی، هاوسەرێتیی جگە لەوە هیچ شتێكی تر نانوێنێ.

دڵپاك: من لارییم لەوەدا نییە كە بڵێیت بە بیرو ڕای خۆم، بە بۆچوونی خۆم، چونكە ئەكرێت وایان تێگەیاندبێتو مێشكت هەر ئەوەندەی گرتبێتە خۆ، بەڵام ئەمەشو ئەوەش، هەردووكیان لە ڕاستییەوە دوورن، واتە قسەكانتو بۆچوونەكەت هەردووكیان ناوێزەو چەوتن، باشە، بەڵگەت چییە هەتا ئەو داوایان بۆچوونەتی پێ بسەلمێنی؟

پرشنگ: ئاخر ئەوەی كە گوتم، حەقیقەتە.. حەقیقەت. بۆچی لە حەقیقەت ڕابكەین مامۆستا دڵپاك، ڕاكردن ڕاست نییە.

دڵپاك: لەمەدا لەگەڵتام كە ڕاكردن لە حەقیقەت ڕاست نییە، وەك تۆ منیش ئەپرسم، بۆچی لە حەقیقەت ڕابكەین؟ خۆزگە ئادەمیزاد نەیتوانییایە لە حەقیقەت ڕایبكردایە!، بەڵام ئەوەتا ویستی خوای گەورە وەهایە كە ئادەمیزاد هەڵبژێر بێت، ئەتوانێ لە ڕاستیی ڕانەكات، لەگەڵ ئەوەشا ئەشتوانێ ڕا بكات لێی.

كاتێ من كە ئەڵێم شووكردن خزمەتكارییو كارەكەریی نییە، لەسەر ڕۆشنایی ئیسلام ئەو بڕیارە ئەدەم، بەڵگەم فەرموودەی خواو پێغەمبەرە ﷺ، ئەو بەڵگەیەش ژیریی و ویژدانی پاكو ساغ پەسەندی ئەكەن، بەڵام قسەكانی تۆ جگە لە تەمو مژی حەزو هەوەس هیچی تر نین.

وەك چەند بارەمان كردەوە، خوای گەورە ئەفەرموێ: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً)(النساء: 1).

ئایا ئەم ئایەتە گەواهیی نییە لەسەر ئەوەی كە سەرچاوەی هاتنی ئافرەت و پیاو یەك سەرچاوەیە، كە ئەویش یەك دەروونە؟ بە ئاشكراو ڕوونیی نیشانمان نادات كە لە مرۆڤایەتییدا یەكسانن؟ ئەی ئەو یەكسانییە نابێت لە دنیادا بەدی بێت؟ ئایا دەرچوون لە یاساكە تاوانو ستەم نییە؟ لە چیدا كارەكەری و خزمەتكاریی ئەنوێنێ؟ ئەگەر ئەوە كارەكەریی بێت، ئەی ئەو هەوڵو كۆششە كە پیاو ئەیداتو ئەیكات بۆ ژنو منداڵەكانی ئاغایەتییە؟ ئای لەو ئاغایەتییە!

با پەنا بەرینە بەر تیشكی یاسا قورئانییەكان، یاسای ژمارە (21)ی ناو سورەتی (الروم) ئەفەرمووێ: (وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجاً لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ).

ئەم یاسا قورئانییە، ئاماژەی بۆ سێ خاڵی زۆر وردو گرنگ كردووە، كە خاوەن بیران لێیان تێئەگەن، ئەمانەن:

أ. ئافرەت لە دەروونی پیاو خەلق كراوە، جەوهەری پیاوو ئافرەت یەك جەوهەرە، بەڵام ئەو جەوهەرە لەت بوو بە دوو لەتەوە، یەكێكیان بوو بە پیاو، ئەویتریان ئافرەت، ئایا باسی ئاغاو خزمەتكاری تێدا بەدی ئەكرێت؟ بۆنی سەرمایەداریی و پرۆلیتارێتیی لێدێت؟.

ب. ئۆقرەگرتنو ئارامبوونەوە، ئارامییو ئۆقرە (السكن)، بە شێكی ئەو دەروونە وا لە كن بەشەكەكی تردا، جا سەیر لەوەدایە بەشی ئارام لێهەڵگیراو بەر پیاو كەوتووە نەك ئافرەت، ئەگەر لێرەشدا نەڵێن دەی با ئارام لێهەڵگیراو ئافرەت بوایە، ئەها سەرنج لە ڕاناوەكە بدەن، (ها) لە (لتسكنوا اليها)دا. خۆ هەمووتان ئەزانن ڕاناوی لكاوی (ها) لە زمانی عەرەبیدا بۆ تاكی بزری مێ، (مفرد غائب مؤنث) بەكار دێت، جا بەو پێیە، هێمنییو ئارامیی ئۆقرە، شتێكی ئاڵوگۆڕ پێكراو نییە لە ئەمیانەوە بۆ ئەویتریانو بە پێچەوانەشەوە، نا، بەڵكو لای ئافرەت دەست ئەكەوێو پیاو ئەبێ بگەڕێ بۆیو هەر لای ئافرەتیش ئەی دۆزێتەوە، ئایا ئەوەش نیعمەتێكی بەرزو گرنگ نییە كە خوا بەخشیویەتی بە ئافرەت؟

جوان: ئاخر ئافرەتیش بەبێ پیاو ناگاتە مەبەستو ئاواتی خۆی، هەروەك ئەبێ پیاو بگەڕێت بۆ ئافرەت، ئەبێ ئافرەتیش بگەڕێ بۆ پیاو، ئەی شێوەی سروشتی (جنس) لە بە یەكگەیشتنی ژنو پیاودا ڕوو نادات؟ ئەی ئافرەتیش وەك پیاو ئەو قڕ (تهيج)ەی نییە؟

دڵپاك: خوشكەكەم. لێرەدا ئارامیی و ئۆقرە جنس ناگەیەنێ، ئەها پێشەوا (فخرالدین الرازی) ئەڵێت: "الیها، كە ئارامیی و ئۆقرەی لێوە وەرئەگیرێت، لایەنی گیانیی ئەگرێتەوە، نەك جنسیی، چونكە وشەی (الی) بۆ مەبەست هاتووە كە دڵە، دەروونە، گیانە، لە كاتێكدا (عند) ئاوەڵكرداری شوێنییە"، واتە: ئەگەر یاساكە بیگوتایە (لتسكنوا عندها) ئەوكاتە ئارامیی و ئۆقرەكە لاشەیی ئەبوو، جنسی ئەگرتەوەو ئەگەیاند، بێگومان ئەوسا قسەی تۆ ڕاست دەرئەچوو، چونكە هەردووكیان تیایا بەشدار ئەبوون.

نەشمین: لێی مەگرن، جوان لە ڕێزمانی كوردیشدا هەر كۆڵە.

جوان: دا لەو قسە بێجێیانە بكەوە، وا نەبێت خۆت زۆر زاناو ژیر بیت.

پرشنگ: بڕایەوە، كاتی قرەو هەرا نییە، پرسیارەكەی منتان كرد بەژێرەوە.

دڵپاك: لەبیرم نەچۆتەوە پرشنگ خان، خاڵی یەكەمو دووەممان باسكرد.

ج . (وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً )، كە بەرهەمێكی گیانیی و كۆمەڵایەتییە، لە ژنو مێردەوە ئەو بەرهەمە دەستئەكەوێت، لە پەیوەندییانەوە پەیدا ئەبێ، دەی فەرموو پێم بڵێ، چ ئامانجێك، چ دركاندنێك، چ شاراوەییەك بەدی ئەكرێت لەو ڕووەوە كە تۆ باست كرد؟، كارەكەریی و خزمەتكاری لە چ وشەیەكی یاساكەدا خۆی ئەنوێنێ؟

ورد ببنەوەو چاك سەرنج بدەن، ئادەمیزاد وای دێتە بەرچاو كە ژنو مێرد كتومت وەك سالبو موجەبی كارەبان بە هەردووكیانەوە لە جیاتی ئەوەی جیهانێكی كارەبا دروست بكەن، جیهانێكی مرۆڤایەتیی دروست ئەكەن، چونكە هەردووكیان مرۆڤن.. مرۆڤ.

بۆ ئەوەی زیاتر بۆتان ڕۆشن بێتەوە كە ئەو ئارامو ئۆقرەگرتنە هی گیانە نەك لەش . پەڕین .، ئەبینین پیاوە پیرەكان كە ڕەگو دەماری جنسییان . ئەگەر نەمردبێت . سیسو كز بووە، زیاتر لە گەنجەكانو لە وەستاوەكان، ژنەكانیان خۆش ەوێتو زیاتر ڕێزی ژنیان لا هەیە، كە دەیاندوێنی یەكسەر ئەڵێن: "ژن بۆ سەردەمی پیری باشە!"، بۆچی؟، چونكە دڵیان لە پاڵ ژنەكانیاندا ئۆقرەو ئارام ئەگرێت.

ئیعجازی قورئان بە تەواوەیی لەوەدا دەرئەكەوێ كە لەدوای ئەو سێ خاڵەوە ئەفەرموێ (إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ)، بەڵێ، بەڵگەو دەلیل لەوەدا بۆ گەلو نەتەوەو كۆمەڵگەیەكە كە مێشكی وریا بێت، دڵی بەئاگا بێت، بیرو هۆشی لە جێی خۆیا مابێت، حەقیقەتی لێ نەگۆڕابێت، كەڵكو قازانج لە زەرەرو زیان، پاك لە پیس جیا بكاتەوە، نەك ئەوانەی كە بۆ تێركردنی ورگو ناوگەڵ ئەژین[1].

## بەرگو كاڵاو پۆشاكن بۆ یەكتر

دڵپاك: خوشكو برا بەڕێزەكانم. لە یەكترگەیشتن پێویست بە تووڕەبوون ناكات، بۆچی لە كاتی پرسیاركردندا یان وەڵامدانەوەدا خۆمان جكو زیز بكەین؟، بۆچی خۆمان لە هەق لابدەین؟، داوا ئەكەم لە خوا، كە دەمی خونچەی دڵتان بە سروەی باوەڕ بە ئیسلام بكرێتەوە، ئەوەندەش زاناو داناو هۆشیارتان بكات، كە منو سەدەها كەسانی تر، بە شانازییەوە بێنە خزمەتتان بۆ وەرگرتنی زانستو مژینی شیلەی باوەڕو مسوڵمانەتیی، ئەو كاتە ئای كە میللەت بەختەوەرو كۆمەڵگە بێگەردو ژیان پڕ لە شادمانیی ئەبێت!.

هیوادارم چاوی دڵو مێشكو باوەڕتان بكرێتەوەو بەوچاوە كراوەوە بڕواننە مەسەلەی هاوسەرێتیی، هەتا پۆشتەو پەرداخ بنو بەرگو كاڵای هاوسەرێتیی، هەر نهێنی كە هەتانە بیشارێتەوە .

سەربەست: جا هاوسەرێتیی لە كوێ و پۆشتەو پەرداخیی كاڵاو بەرگ لە كوێ؟

دڵپاك: ئێمە باسی ئەوەمان كرد كە ژنو مێرد لە ئیسلامدا لە كایەی (المودة والرحمة)دا ئەژین، بەوەش لەگەل

---
1 تەماشای (الحجاب)ی مەودودیو (الاسلام وقضایا المرأة المعاصرە)ی البهی الخولی بكە،

یەکتردا ڕادێن، ئیتر دۆستایەتیی و خێرو بێرو بەزەیی لە هەردووکیاندا ئەدرەوشێنەوە، پرشنگ ئەهاون، ئەبێ گەیشتنی مرۆڤ بە مرۆڤ، مرۆڤایەتیی دروست بکات، هەروەك گەیشتنی بیر بە بیر کە ماناو بیردۆزو سەلمێنراوی زانیاری لێپێکدێت.

سەبارەت بە پەیوەندیی نێوان ژن و مێرد، ئیسلام بەوەش نەوەستاوەتەوە، ئەوەتا بەشێکی تری یاسای قورئانیی، بەمشێوە سەیرە بێ وێنەو بەرزە داڕێژراوە: (هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُن) (البقرة: 187).

کە ئەمجارەش ئافرەت پێش پیاو خراوە، پەندێکی عەرەبیش ئەڵێ: "الفضل للمتقدم"، بە واتایەکی تر، پێش ئەوەی پیاو کاڵاو بەرگ و جلو پۆشاك بێ بۆ ئافرەت، ئەم وایە بۆ ئەو، ئەم شوبهاندنە هەر زۆر گرنگ و واقیعی و بەرزەو گەلێ پێویستیی بە لێکۆڵینەوە هەیە، بەڵام داخەکەم! کەسێ کە لە گەرمەی (تا)دا بقرچێتەوە، چۆن تامی شیرینی هەنگوین ئەزانێ؟

کاڵاو پۆشاك، جلو بەرگ، پۆشەرو پارێزەری لەشی ئادەمیزادن، نەنگ و شوورەیی و ناتەواویی لەشی ئادەمیزاد ئەشارنەوە، (هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُن)، بەڵام ئەم کاڵاو پۆشاك و بەرگە ئێجگار مەوداکەی فراوانترە. سنوورە تەسکۆڵەو بچووکەکەی بە هاناچوونی پەڕیین ئەبڕێت و خۆی ئەگەیەنێتە قوڵایی دەروون و گیان و هەست و نەست، ڕەگ و ڕیشەیان تێدا دائەکوتێ، سنووری لەش و گۆشت و خوێن و هەست (حس) ئەبڕێت و لەوێوە بەرەو چەق و خولگەی گیان و دەروون بەتیژیی لە پەروازدایە.

دۆستایەتیی و بەزەیی پیاهاتنەوە پاراو ئەکات و بە ناسکیی هەروەك سروە خۆی ئەگەیەنێتە هەوارگەی دەروونیی و گیانیی، بەوەش هەریەکە لە ژن و مێرد ئەکاتە قەڵغانێك بۆ ئەویتر، چ لاشەیی و چ دەروونیی، لەوەش گرنگتر، هەریەکەیان ئەکاتە گەنجینەی هیواو مەبەست و ئاواتە زۆرو جیاوازەکانی ئەویتر، هەرکامیان ئەگریت هەم نازدارەو هەم نازکێش، دەی توخوا ئەو هەمووە، بە بەیەکگەیشتنێکی کتوپڕیی و ساتیی جنسیی ڕووت، لە هەر لایەکدابێت، دێتە دی؟ ئەی بۆچی ئەو بەیەکگەیشتنە نەکەین بە بەیەکگەیشتنێکی ڕەوای هەمیشەیی دامەزراوی ڕێکو پێك کە ئیسلام پێی ئەڵێت: هاوسەری (الزواج)و کە ئەشبێتە مایەو پایەی دامەزراندنی خێزان و خێزانداریی؟.

خوشك و براکانم، ئای ئەو خێزانداریبە چەندێ پێویست و بە کەڵکە بۆ کات و سەردەمی پیریی ژن و مێرد، ئەو پیرییەی کە هێزو وزەو جووڵەو جوانیی، هەموویان ماڵئاوایی لێئەکەن و ئیتر نایەتەوە بەلایان تەنانەت قرو گرو خارۆشی تێرنەبوونی جنس، کڵپەو بڵێسەیان بەو ئاوی پیریی دائەمرکێتەوە، کەچی ژن و مێرد، بە هانای یەکترەوە هەر دێن و خۆشەویستیی و دۆستایەتیی و ڕێزو بەزەیی و میهرەبانییان بەرامبەر یەکتر ئەگەر بەتین نەبێت و زیاد نەکات، کەم ناکات!

هەڵکەوت: مامۆستا دڵپاك، ئەگەر موسڵمانێتیی بەمشێوەیە بێت کە تۆ باسی ئەکەیت، پاکە، جوانە، بێگەردە، بەڵام من ئەمەیان لەناو خەڵکا نابینم، نا، مسوڵمانان بەمشێوەیە نین و ناجووڵێنەوە، بۆیە..

دڵپاك: من باسی ئیسلامت بۆ ئەکەم.. ئیسلام، ئێوەش هەڵەکانتان لەوەدایە کە ڕەخنەکانتان ئاڕاستەی ئیسلام ئەکەن، نەك مسوڵمانان، ئیسلام بەرنامەو ڕێبازێکی خواییە، بۆ ئادەمیزاد بە تێکڕا ناردوویەتی، جا مسوڵمان ئەو کەسەیە کە بە چاکیی و پاکیی پەیڕەویی ئیسلام ئەکات، هەرکەس پەیڕەوی نەکرد ئیتر کەی ڕەوایە پێی بگوترێت مسوڵمان؟ بۆچی موسڵمانەتیی بە کردارە یان بە ناو؟.

ئەوانەی کە تۆ مەبەستتن، نەك هەر مسوڵمان نین، بەڵکو تانەن لە گلێنەی چاوی ئیسلامدا، لەکەن لە ئاسمانیی پاکی ئیسلامداو ستەمی لێئەکەن، نازانم ئێوە دڵنیان لەوەی کە ئیسلام ئەوانە بگرێتە خۆی؟، بەڵێ، ئەزانم ئەوانە بوون بە کۆسپ لە ڕێگەی مسوڵمانبوون و ئیسلامپەروەریی هەزارەها گەنجی خوێندەوارو نیمچە ڕۆشنبیردا، ئەوانە تەنها بەرواڵەت مسوڵمانن، لە ڕێی چاولێکەرییەوە فێری مسوڵمانەتیی بوون، پەی بە گیان و بەرنامەو یاسا بەرزەکانی نابەن،

ئەی هەزار ڕەحمەت لە گیانی پاکی مامۆستا (موحەممەد عەبدە) کە گوتوویەتی: "ئەگەر ویستمان سەربەستەکانی ئەوروپا بانگ بکەین بۆ ئەوەی بێنە ناو ئاینەکەمانەوە، یەکەمجار ئەبێ قایلیان بکەین کە ئێمە خۆمان مسوڵمان نین..".

ڕەنگە لاریی لەوانەوە لە نەزانینی و نەخوێندەوارییەوە بێت، دەی خۆ ئێوە خوێندەوارن، ڕۆشنبیرن، بەچکە مسوڵمانن، دەی فەرموون با ئێمە لە خۆمانەوە دەستپێبکەین، با ئێمەی ڕۆشنبیر ببینە پێشەنگ، ئایا ناکرێت؟!

## گومکردنی ڕاڕەوی مامناوەندیی

جوان: هەمووومان ئەزانین کە گیروگرفتو قرەو ناکۆکیی لە نیوان زۆربەی ژنو مێرددا هەیە، نەك هەر لە وڵاتی ئێمەدا، بەڵکو لە زۆربەی شوێنیی سەر ڕووی زەویدا، ئاخۆ هۆی ئەوە چی بێت؟

دڵپاك: ڕاست ئەکەی، بێگومان هۆی ئەوە تەنیا یەك هۆ نییە، گەلێ هۆیە، بەڵام هەرەگرنگەکانیان دوانن کە ئەمانەن:

### 1ـ پەی نەبردن بە لایەنی مام ناوەندێتیی

ئەبێ پەیوەندیی نێوان ژنو مێرد، ئەرك و مافیان لەو خێزانەدا کە پێکەوەی ئەنێن، دیاریکراوو دامەزراوو دادپەروەرانە بێت، لەگەڵ سروشتی هەریەکەیاندا بگونجێت، دژ بە سیفاتو پێکهاتنو دڵو دەروونو بیری نەبێت، واتە پیاو خۆی بناسێت کە پیاوە، ئافرەتیش خۆی بناسێتو بزانێت کە ئافرەتە نەك پیاو، ئەمە لەلایەکەوە.

لەلایەکی ترەوە، کە ورد ئەبینەوەو سەرنج ئەدەین، چ لە مێژوودا و چ ئێستا، دوو ڕاڕەوی هەڵەی دژ بەیەك دیارن کە گیروگرفت دروستکەرن لە نێوان ژنو مێرددا، هەروەك ڕاڕەوێکی تر جگە لەو دووانە نەبێت، یەکەمیان، هەندی نەتەوە لە کۆنو تازەدا، سەروکارکردنی ماڵو سەرۆکایەتیی خێزان بە ئافرەت ئەسپێرن، واتە پلەی یەکەمینی دەدەنێ، لە کاتێکدا نەتەوەیەك نابینن کە لەو جۆرەبێت و بە پلەیەکی بەرزو پاکی پێشکەوتنو شارستانییەت گەیشتبێ، بە درێژایی مێژوو نەتەوەیەك نابینی کە سەرۆکایەتیی بە دەست ئافرەتەوە بووبێتو توانیبێتی هێزو دەسەڵاتو ڕێز لەخۆنان بۆ ماوەیەکی درێژ بە دەست بهێنێ.

ژێرپێخستنی بوونو نرخی ئافرەت دووەم ڕاڕەوی ئەو گیروگرفتەیە کە زۆربەی نەتەوەکانی سەر ڕووی زەویی، پلەی یەکەمین تیایاندا هی پیاوەو هی پیاو بووە، سەرۆکایەتیی دراوەتەدەست پیاو، پیاویش ئەوەی بە هەلزانیوەو ستەمی لە ئافرەت کردووەو بێبەشی کردووە لە مافە ڕەواکانی، ئافرەتی بردۆتە ئاستی بەندەو کەنیزەكو نۆکەری خۆی، کردوویەتی بە ئامێری دەستی ئارەزووی، بەهۆیەك بۆ بەسەربردنی قری هەوەسو حەزی خۆی، دیارە ئەم ڕاڕەوە کەمرەوییو ئەوی پێشوو زیادەڕەویی تیایەو هیچ کامیان ئافرەت بەرەو بەختیاریی نابەنو نەشیانبردووە.

خۆ ئەگەر پیاوان سۆزو بەزەییان لە دەرەوەی ماڵدا جۆشابێ بۆ چینی ئافرەت، جاروبار بە خشڵی زانیاریو هونەرو ڕۆشنبیری ئافرەتیان ئارایش دابێت، ئەوە لەبەر ئەوە نەبووەو نییە کە پیاو هەستی بە ستەملێکراوییو بەدبەختیی ئافرەت کردووە، چونکە ئەگەر لەبەر ئەوە بوایە، خۆ خێزان لە پێشترەوەیە، ئەی بۆچ هەرکەسێ لە خێزانی خۆیەوە دەستی پێنەکردووە؟

لە ڕاستیدا ئەوەش گەرەلاوژەیەك بووە بۆ ئەوەی ئافرەت فێربێتو بزانێت بەڕێگەیەکی لێزانانەتر، بەشیوەیەکی هونەرمەندانەو خۆشو بەتام تر، بچێت بەدەم خواستە جنسییەکانی پیاوەوەبۆ ئەوە بووە نەشئەبازیی خۆی بە بیستنی ئاوازی مۆسیقای دەنگی ناسکی ئافرەت کە تێکەڵ ئەبێت بە دەنگی لەراندنەوەی ژێی ئامێرە مۆسیقییەکانی دەستی، پەرە پێبدا، دڵی بە سورو سەمای لەشی سافو جوانی پاراو بکات، دواییش ئارەزووی پێدامرکێنێتەوە، بەڵام لە ئەنجامی ئەوەشدا ئەو نەتەوانە پاش بڕینی چەند مەنزڵێك لە مەنزڵەکانی کاروانی ژیاندا، لە ئەنجامی ڕەشی ئەو ڕەوشتە ناپەسەندەوە سەلامەتیی بەجێی هێشتوون.

### 2ـ نالەباریو ناسازیی پەروەردەکردن

ئاواز: مەبەستت لەم خاڵەیان، یاخۆ لەم هۆیە چییە؟ چۆن؟

پەلەتکرد ئەگینا ئەو پرسیارە پێویستی نەئەکرد، بەڵام توخوا هەروەك فێری ڕێگەو ژیانی بەدەستهێنانی بژێوی (معیشة) ئەکرێن، چ لە ماڵەوەو چ لە قوتابخانەدا، بەو جۆرەش بایەخ بە پەروەردەکرنمان ئەدرێت؟

بەتایبەتیی لە بواری ژیانی هاوسەرییدا، چ پەروەردەیەك ئەکرێین؟ چیمان خوێندووە؟ کێ بکەین بە نموونە بۆ ئەوەی لە چاکییدا هەوڵی چاولێکردنی بدەین؟ سارتەرو خێزانەکەی؟ ئەکتەرە خۆرئاواییە جنسپەرستەکان ڕەنگە هەست نەکەن بەوەی کە پەروەردەکردن وەك بژێویی بۆ ئادەمیزاد پێویستە!

نەشمین: ئەی باشە چار چییە؟

دڵپاك: چار هەر ئەوەیە بگەڕێینەوە ژێر ئاڵای ئیسلام، یاساکانی لە ژیانماندا ڕەنگبدەنەوە، چونکە ئەو بەرنامە خواییە ڕاڕەوێکی مامناوەندییە، پیاو لە سایەی ئەو بەرنامەیەدا خۆیو ئەرك و مافی خۆی ئەناسێتو ئەزانێ، ئافرەت خۆیو ئەركو مافی خۆی ئەناسێتو ئەزانێ، هیچکامیان خۆی لێناگۆڕێتو ڕۆڵی خۆی بزر ناکات، هەروەها پڕە لە پەروەردەی پاکی بەرزی لەگەڵ فیترەتدا گونجاو، پەروەدەیەك کە پەرە بدات بە سیفات و بەهرەی تایبەتی هەریەکەیان، پەروەردەیەك کە نەهێڵێ هیچکامیان لە سنووری خۆی بچێتە دەرەوە.

## کورتە سەرلێدانەوەیەك لە ماڵ

نەشمین: تۆ بڵێی بێتەوە؟

سکاڵا: دڵنیابە کە دێتەوە، چونکە گوتی دێمەوە؟

نەشمین: ئاخۆ ئەو پیاوە کێ بووبێت کە قسەی لەگەڵدا ئەکرد؟

باجی عائیشە: کچم پیاوی چی؟ باوکی بوو.. باوکی.

جوان: پێش نانخواراردنو دوای نانخواردن قسەیەکی ئەکرد لێی تێنەئەگەیشتم!

سکاڵا: خانم گیان، وا دیارە گوێت قورسە، ئەیگوت: "بسم الله الرحمن الرحيم، اللهم بارك لنا فيما رزقتنا وقنا عذاب النار"، دوای نانخواردنیش ئەی گوت: "الحمد لله الذي أطعمنا وسقانا وجعلنا مسلمين"، ئەوە سوونەتە، چونکە پێغەمبەر ﷺوای فەرمووە.

هەڵکەوت: لە ڕاستیدا مامۆستایەکی زاناو زیرەكو بیرفراوانە.

پرشنگ: لەوەش زیاترن هێمن و نەرمو نیانو خاوەن ڕەوشتی بەرزە.

مام جەمیل: ئەها چەند سەرو دڵی ئەگرن، کەچی ناوچاوی گرژ ناکات!.

نەشمین: چی بوو؟ بردتانە ئاسمان، ئەی بۆچی ناڵێن، کچێکی زمان لووس و فێڵبازو کۆنەپەرستە؟ هەڵکەوتە فەنی وادیارە دڵت گرتوویەتی، ها؟!.

سکاڵا: خوشکە نەشمین، بەداخەوە.. بە داخەوە! کەی ماڤ کردنی ئەو قسانەت هەبوو؟، ئایا ئەو هیچ هەڵەیەکی دەربارەی تۆ کرد؟ پڕوپاگەندەی ناهەق کارێکی چاكو جوان نییە، بە تایبەتیی بۆ ڕۆشنبیرێك کە خەڵك بە کۆنەپەرست ناو ببات، من زۆرچاك ئەزانم، چی پاڵی پێوە نایت بۆ کردنی ئەو قسەیە، جا من بە وەکالەتی دڵپاکەوە پێت ئەڵێم: تێر تێر بخەوە، هیچ خەمت نەبێ، ترسو گومان بۆ خۆت مەسازێنە، تێگەیشتیت؟

جوان: هەرچی بڵێن بەو کچە، ڕەنگە گوێتان بۆ بگرم، بەڵام وشەی کۆنەپەرست نا، کۆنەپەرست ئەو کەسەیە کە مێشکی بەنج کرابێت، دەی ئەوەش ئێمەین، نەك ئەو، توخوا ئێمە چی ئەزانین.. چی؟!.

هەڵکەوت: جوان ڕاست ئەکات، منیش دانی پیادا ئەنێم کە مێشکم، هۆشو بیرم گرتی، نەك دڵم، تێگەیشتی نەشمین؟

سەربەست: کورە بەشەرەفم هەرچییەکی گوت هەمووی ڕاستە، هەمووی موتابیقی ئارای بلیمەتو کەڵەزاناکانە، ئێمە

هەر لە خۆمانەوە ئەیکوتین، بەبێ بەڵگە بە هەوەسی خۆمان ئەدوێین، هەق هەیە ئەو بە ئێمە بڵێ کۆنەپەرست.

نەشمین: ئەرێ ئەوە چیتانە؟ وی ئەوە بۆچی هەمووتان خۆتان کرد بە خوشكو براو دڵسۆزی؟ خۆ هەر ئەوە ماوە کە بمخۆن، ویی!.

ئاواز: خوشکە نەشمین، ڕەنگە تۆمان لەو خۆشتر بوێت، بەڵام هەقیش هەقە.

پرشنگ: نەشمین، تۆ هاوڕێمانی، تۆ نزیكو دەستەخوشکمانی، ماوەیەکە ئێمە ئەو ئەناسین، بەڵام داننان بە واقیعو ڕاستییدا تاوان نییە.

نەشمین: ئێ دەی باشە ئیتر من دەمم دائەخەم، قڕو قەپ، حەز ئەکەن هەرچییەکم گوتووە بۆی بگێڕنەوە، ئیتر نەبڕایەوە؟.

سکاڵا: خوشکە گیان ئەوەی ناوێ، هیچ کەسیش بۆی ناگێڕێتەوە، ئەگەر بۆیشی بگێڕنەوە، کێچێ نابێت بە میوانیو زەردەخەنەی خۆی تێکنادات، مەگەر تەنیا من بیناسم، ئۆف، کاتی خۆی چەند تانەو تەشەرم لێئەدا، چەند قسەی تاڵم ئەدا بە تاڵیا، چەند ئیشی نابەجێم لە دژی ئەکرد، لە قوتابخانە، لەماڵەوە!! ئۆف!!، کەچی ئەو وەك کێوی پیرەمەگروون، دامەزراوو نەجوڵاو، بەبێئەوەی کە قسەیەکی تاڵی لەدەم دەربچێت، زەردەخەنەش لە زاری. لە ڕوومەتی ئاوا نە ئەبوو، هەر ئامۆژگاری ئەکردم، قسەی بە پێزی لێ نە ئەشاریمەوە، گفتوگۆی، جموجووڵی لە گەڵما سۆزیان لێ ئەتکا.

ئێستا کە بیری ئەوکاتە ئەکەمەوە شەرم دامئەگرێت، خەریکە داوەشێم، کەچی یەکێك لەو قسەو هەڵوێستانە ناداتەوە بە ڕوومدا، هەروەك هیچ نەبووبێت، بەڵێ، ئەو ڕەوشتە بەرزە جوانەی کەمەندکێشی کردمو بڕیارمدا کە ژیانی خۆم بگۆڕم، بچمە سەر ئەو ڕێگایەی کە ئەو لەسەریەتی.

سەربەست: بەخوا سکاڵا. منیش پشتگیری ئەو ژیان گۆڕینەت ئەکەمو پیرۆزبایشت لێ ئەکەم، یەکەمجار هەڵەو نەزان بووم، ببورە کە سەرودڵم گرتی.

نەشمین: ئەی گاڵتەو قڕەو هەڕەشەکانی دوێنێ بەرەو کوێ فڕین؟.

سەربەست: ئەی نەمگوت هەڵەو نەزام بووم؟! داوای لێبوردنم نەکرد؟!

سکاڵا: داننان بە هەڵەدا کارچاکییە، سوپاست ئەکەم سەربەست، بۆچی نازدارو بەهاریش چوون لەگەڵ مامۆستا دڵپاکدا؟

باجی عائیشە: بەڵێ کچم، ئەوەندەیان خۆش ئەوێ حەز ناکەن بەجێی بهێڵن، دەك خۆزگەم بەو ماڵەی کە ئەو ئەبێتە کەیبانووی، دەنگی جەڕەسە با بچم.

(پاش سەلامکردنو بەخێرهاتنەوە).

دڵپاك: داوای لێبوردنتان لێئەکەم، خاڵۆمو منداڵەکانی هاتبوون بۆ ماڵمانو داوای دیدارمیان لە باوکم کردبوو، ئەویش دڵی نەشکاندبوون.

## تەرازوومان چی بێت؟

باجی عائیشە: توخوا ڕۆڵەگیان، ئیتر واز لەو کچە بێنن، ماندووتان کرد، دوو شەوو ڕۆژە داتان گرتووەتەوە، ئیتر ڕێتان پێنادەم با بە سبێت.

دڵپاك: ئەگەر باجی عائیشە ڕێم بدات، منیش پرسیارێك لە ئێوە ئەکەم.

باجی عائیشە: ڕێی تۆ ئەدەم، بەڵام هی ئەوان نا، فەرموو پرسیارەکەت بکە.

دڵپاك: خوشکان، برایان، ئایا ئێوە ناحەزو دوژمنی ڕاستیین؟

نەشمین: نەخێر.. کەسمان دوژمنو ناحەزی نین.

پرشنگ: بە پێچەوانەوە، یارو دۆستی ڕاستیین، ڕاستیی خۆشە.

دڵپاك: بەڵام ڕاستیی چۆنە؟ کامەیە؟ چەندە؟

هەڵکەوت: ڕاستیی تەنێك نییە تا نیشانی بدەم و بڵێم ئەوەیە، یان بیهێنمە بەردەستت، یەکێکیشە، ئیتر چەندی چییە؟

دڵپاك: ئەوە ڕاستە، بەڵام ئایا ڕاستیی لای هەمووان هەر یەکێکە؟

سەربەست: مادام ڕاستی یەکێکە ئەبێ لای هەموانیش هەر یەکێك بێ، وا نییە؟

دڵپاك: (ئەبێ) شتێکەو (واقع) شتێکی تر، لەبەر ئەوە وانییە، با پێت بڵێم: دز کە دزی ئەکات، کارەکەی بە ڕاست ئەزانێ، فرۆشیار گرانفرۆشیی بە ڕاست ئەزانێ، بەدمەس، سەرخۆشییەکەی بە چاك و ڕاست ئەزانێ، گیرفانبڕ ئیشەکەی بە ڕاست ئەزانێ.. هتد، هەروەها پزیشك بڕینی ئەندامێك کە تووشی شێرپەنجە (سرطان) هاتبێ بە ڕاست ئەزانێ، کوشتنی کابرایەك کە برای یەکێکی کوشتبێ لە لایەن براکوژراوەکەوە بەڕاست ئەزانرێ.. هتد. دەی لەمانەدا چی بکەینە تەرازوو بۆ دۆزینەوەی ڕاستیی؟

هەڵکەوت: بێگومان زانیاریی، ژیریی، چاکترین تەرازوون بۆ ئەو مەبەستە.

دڵپاك: زانیاریی بەرهەمی ژیرییە، چونکە ئەو کەسەی ژیریی نەبێت، زانیاریشی دەست ناکەوێت، واتە ئەوەی کە سەرەکی بێت ژیرییەکەیە، بەڵام ئایا ژیریی ـ با زانیاریشیی لەگەڵدا بێت ـ ئەتوانێ لە کێشانەدا بە تەواویی و پاکیی سەرکەوتن بەدەستبهێنێ؟

ئاواز: بەڵێ.. بێگومان زۆرچاك ئەوە ئەتوانێ.

دڵپاك: پیاوێك گونییەیەکی پێیەو تا نیوەی، یان دوو لەسەر سێی شەکری تیایە، لە پێنج، شەش یان حەوت کەس ئەپرسێت، ئەم گونییە چەند شەکری تیایە، لە کاتێکدا ئەو کەسانەش ژیرو خوێندەوارن، ئایا وەڵامی هەموویان لەیەك ژمارەدا ئەبێت؟ ئایا هەیانە ژمارەکەی کتومت دەربچێت؟

ئاواز: لەوانەیە لە دە ملیۆندا جارێك بیگرێت و ڕاست دەربچێت، ئەشگونجێ هەر نەیگرێت و ڕاست دەرنەچێت.

دڵپاك: (لە دە ملیۆن جارێك)، ئەویش بە وشەی (لەوانەیە)، ڕاست ئەکەی. کەواتە دۆزینەوەی ڕاستیی، بە ژیریی و زانیاریی ڕووت زۆر زەحمەتە!.

هەڵکەوت: تۆ ئەتەوێ بڵێیت، ئادەمیزاد توانای دۆزینەوەی ڕاستیی نییە، ئەوەش کەمکردنەوەی نرخی ئادەمیزادە.

دڵپاك: کەمکردنەوەی نرخی ئادەمیزاد نییە، بەڵام ئادەمیزادیش هەموو شتێك نییە، لە هەموو شتێکدا تەواویی (الکمال)ی پێ نەبەخشراوە، هەموو هێزو وزەکانی سنووردارن، ناتوانن لەو سنوورە بچنە دەرەوە، ئەوەتا زۆر چاك ئەزانین لە تاریکییدا، لە ڕووی بینینەوە بە قەدەر پشیلەی لێنایەت، لە ڕووی سەرماو سۆڵەوە بەقەدەر قازێك یان مراوییەکی لێنایەت، ئەمەش هەر بۆ نموونە نەك هەڵدان.

جوان: بەخوا ڕاستە، ئەی وا نییە کاك هەڵکەوت؟ دەی قسە بکە.. دەی.

پرشنگ: بۆ مەسەلەی شەکرەکە، بە تەرازوو ئەیکێشین و ئەزانین کتومت چەندە؟ ئایا بەوەش ڕاستیمان دەستناکەوێت؟

دڵپاك: بەڵێ، بەو جۆرە ڕاستیمان دەستئەکەوێت، واتە ژیریی و زانیاریی بۆ دۆزینەوەی ڕاستیی پێویستیان بە تەرازوویەك هەیە، ئەبێ شتەکان بەو تەرازووە بکێشرێن، تا ڕاستییەکە دەربکەوێت، وەك ئەزانن ئەو تەرازووە خاترو بێخاتریی ناکات، واتە بۆ هەموو کەسێك وەك یەك کێشانە ئەکات.

نەشمین: جا مەبەستت لەم باس و لێکۆڵینەوەیە چیبوو؟

دڵپاك: مەبەستم ئەوەیە کە ئادەمیزاد نابێت خۆی بە هەموو شتێ بزانێ، ئەگەر خۆی بە هەموو شتێ زانی ئەوە زیانمەندیی بۆ خۆی سازداوە، خۆی خۆی تووشی گێژاویی هەڵەکاریی کردووە، هەرگیز ناتوانێ پەی بەڕاستیی بەرێت،

خوای پەروەردگار تەرازووی بۆ ناردووین تا ڕاستیی پێ بدۆزینەوە، ئەو (قیاس)و تەرازووەش ئایینە، ئایین، ئەبێ کردارو گوفتارمان بەو ئایینە بکێشین، دەی ئەگەر بمانەوێ بەرەو بەختیاریی ئافرەت هەنگاو بنێین، ئەبێ هەنگاونانەکەمان بەو تەرازووە بکێشین، ئەبێ بەختیارییش بە گشتیی‌و بەختیاریی ئافرەت بە تایبەتی، هەر بەو تەرازووە بکێشین، ئەگینا بەختیاریی ئافرەت هەرگیز نایەتە دی.

# بەشی پێنجەم

## بۆ هەردوو لایان هەر ستەمە

سکاڵا: دوێنێ و پێرێ زۆرمان ماندووکردیت خوشکە دڵپاك، بەڵام هێمنیی ژیانی گوند ماندوویەتیی ئەڕەوێنێتەوە، چاك فریای دەوامیش کەوتین.

دڵپاك: گوێتان لە ماندووبوونی من نەبێت، ژیان بە ماندووبوونەوە خۆشە.

ئاواز: لە ناو مسوڵماناندا دیاردەیەك بە شێوەیەکی فراوان ئەبینرێت، ئەویش ئەوەیە کە کچەکانیان، یان خوشکەکانیان هەروا بە هەڕەمەکیی ئەدەن بە شوو بە کەسێك کە لەوانەیە ئەو کچ و کوڕە یەکتریان نەبینیبێ، شارەزای سرووشتو خووڕەوشتی یەکتر نەبن. ڕەنگە تۆ لە من چاکتر هەست بەو دیاردەیە بکەی، خەڵك زۆری وەها ئەکات، ئایا ئەوە ستەمکردن نییە لە ئافرەت؟

دڵپاك: خۆزگە ئەو سێ وشەیەت ـ مسوڵمانو ئیسلامو خەڵك ـ لە کاتی قسەکردندا لە یەکتر جیا ئەکردەوە، نازانم ڕۆشنبیرەکانمان بۆ چ ئەو سێ وشەیە لە شێوەی (مرادف)دا بەکار ئەهێنن، ئەوانە کەی هاومانان؟!

بە هاوسەربوونی کچو کوڕێك کە یەکتریان لەوەوپێش نەدیبووبێ، بۆچی ستەم تەنها لە ئافرەت کراوە؟ ئەی لە کوڕەکەش نەکراوە؟ ستەم لە هەرکەس بکرێت هەر ستەمە، چ نێرو چ مێ، ئیتر لەبەرچی چاوی ڕاست زیت بکەینەوە و تەماشای ستەمی ئافرەتی پێبکەین، کەچی چاوی چەپ بنوقێنینو ستەمی پیاوی پێنەبینین؟ ئەی ئێمە ناڵێین هەردووکیان هەر مرۆڤن؟

لەلایەکی ترەوە، تاوانی ئیسلام چییە، ئەگەر هاتوو پیاوێك ڕەزامەندبوو بە هەر ژنێ کە شووی پێبکات؟ یان ئافرەتێك کە هەرکەس هات بۆ خوازبێنی کردنی ئەو خۆی ڕەزامەند بوو؟

سکاڵا: باوەڕتان ببێ کە پیاو هەیە. زۆریش نەك کەم. هەر ئەوەندە ژن شووی پێبکات، ئیتر ئەو ژنە هەر جۆربێ، ئەو پیاوە ئامادەیە کە بیهێنێ، ئافرەتیش هەیە، هەرکەس، هەر ناوی پیاو بێ، بێتە پێشەوە بۆی، سەری پێوە نییەو شووی پێئەکات، ئیتر ئیسلام تاوانی چییە لەوەدا؟

ئاواز: بەڵام من لەوەدا سەرم سووڕ ئەمێنێ کە ئیسلام ئەوەندە بایەخی بە مەسەلەی هاوسەریی داوە، کەچی ئیسلامەکان هاوسەرییان بە هەڕەمەکیی دیارە!

دڵپاك: مامۆستاگیان. ئیسلام هەریەك ئیسلامە، تاکە، کۆناکرێتەوە، مەڵێ ئیسلامەکان، بڵێ مسوڵمانەکان، وشەی ئیسلامو مسوڵمانان لە یەك جیابکەرەوە، ئەبێ ئەوەش بزانی، مسوڵمان ئەو کەسەیە کە پەیڕەویی بەرنامەی ئیسلام بکات، ئیتر ئەو کەسە هەرکەسێك بێت، نێر بێ یان مێ، هاوسەریی لە ئیسلامدا کارێکی هەڕەمەکییانە نییە، تۆ بە چاکیی لێی تێنەگەیشتوویت.

ئاواز: باشە، ئەی بۆچی مسوڵمانەکان پەیڕەویی بەرنامەکەیان ناکەن؟

دڵپاك: ناتوانین لەوەشدا هەموو مسوڵمانەکان تاوانبار بکەین، چونکە زۆریان بە پاکیی پەیڕەویی یاساکانی ئیسلام. لە مەسەلەی هاوسەریشدا. ئەکەن، ئەوانەی کە نیمچە مسوڵمانو پەیڕەویی ناکەن، تاوانەکە هی ئەوانە، نەك ئیسلام.

بۆ نموونە: پزیشکێك، لە دوای پشکنینی نەخۆشێك، داوودەرمانو دەرزی بۆ ئەنووسێت، پارێزی بۆ دائەنێت، کەچی نەخۆشەکە، پارێزەکە پشتگوێ ئەخات، داوودەرمانەکە بەکار ناهێنێت، دیارە چاك نابێتەوە، لەوانەشە بمرێت،

کامیان تاوانبارە، پزیشکەکە یان نەخۆشەکە؟

ئاواز: بێگومان نەخۆشەکە تاوانبارە.

دڵپاك: دەی خوشکەکەم، بەرنامەی ئیسلام پاکە، بێتاوانە، دوور لە تەمە، تاوانبارو ستەمکار ئەو کەسەیە کە پەیڕەویی ناکات، ئەگینا هاوسەر ئەبێ لە ڕێگەی هەڵبژاردنەوە بێت، یان بکرێت بە هاوسەر، ئیسلام زۆر بایەخی بە مەسەلەی هەڵبژاردن داوەو بە یەکێك لە مافەکانی ژن و پیاوی داناوە، بە بەردی بناغەی بەختیاریی ژن و مێردی لە قەڵەمداوە.

لە هەرکەس بکرێت، ستەم، ستەمە، بۆ دڵ گوشینە، بۆ دەروون خەمە.

## ئیسلام بایەخی بە هەڵبژاردنی هاوسەر داوە

سکاڵا: خۆزگە باسێکی ئەو هاوسەرهەڵبژاردنەت بۆ ئەکردین، حەز ئەکەم بزانم چۆنە، ئەی ئەوە لە ڕێی هەمووماندا نییە؟ حەز ئەکەم بزانم تا چ ڕاددەیەك ئیسلام بایەخی داوە بەو لایەنە.

دڵپاك: داواکەت بەجێیە، بەڕاستیی ئیسلام پڕاو پڕی خۆی بایەخی پێداوە، چونکە هەڵبژاردنی هاوسەر مەسەلەو هەنگاوێکی ئێجگار ناسك و گرنگە، پەیوەندیی بە درێژایی تەمەنی ژن و مێردەوە هەیە، وەك باسمانکردو ئەزانین، ژن ئارامگەی پیاوە، زەویی و وەردییەتی، هاوبەشی ژیانییەتی، بەڕێوەبەری ماڵیەتی، دایکی مناڵەکانیەتی، نشینگەی دڵیەتی، جێگاو گەنجینەی چپەو نهێنییەتی.

ژن گرنگترین پایەی خێزانە، ئەی مناڵ لەو دەرنایەت؟، گرنگترین سیفات و تایبەتمەندیی لەوەوە وەرناگرێت؟ سۆزو هەستی مناڵ لە باوەشی ئەودا چەکەرە ناکەن؟ بەهرەکانی، زمانی لەوەوە پەرەیان پێنادرێت؟ باوونەریت و داب و ئایین لەوەوە وەرناگرێت؟ ڕەفتاری کۆمەڵایەتیی لەوەوە پێناگات؟ جا مادام ژن ئەمە ڕۆڵی بێت لە ژیانی ئادەمیزاددا چۆن ئیسلام گرنگیی پێنادات؟ چۆن هەڵبژاردن فەرامۆش ئەکات؟

ئیسلام زۆر بایەخی بە هەڵبژاردنی ئافرەت بۆ کردنی بە هاوسەری پیاو داوە، لەوەش گرنگتر، ئەوەی کە یاسا دەستکردەکان گرنگییان پێداوەو پێوەی گرفتار بوون، ئیسلام زوو هەستی بە مەترسییەکانیان کردووە، لەبەر ئەوەش ئەوەندە گرنگیی پێنەداون، مسوڵمانان وریا ئەکاتەوە کە خۆیان لابدەن لەو ئیعتیباراتە پووچەڵە کاتییانەو بە تەنیا بنەڕەتیان نەزانن.

ئاواز: ئەوانە کامانەن؟ ئیعتیباراتی چی؟

دڵپاك: وەك: سامانی زۆر، یاخۆ دەوڵەمەندیی، جوانی لەش و لار، پلەو پایەی دنیایی، بنەچەکاریی، کەسوکارداریی، بەرزو نزمیی چینی کۆمەڵایەتی، کە تاقیکاری لە دوای سیانزە، چواردە سەدە، دەریخستووە کە هەڵبژاردنی هاوسەر لەسەر ئەساسی ئەو جۆرە شتانە، بەرهەمەکەی ترش و تاڵ و سوێر دەرئەچێت، ئەنجامەکەی زیانبەخش و پڕ لە پەشیمانیی ئەبێت.

جا بۆیە پێغەمبەر ﷺ، موسڵمانانی وریاو ئاگادار کردۆتەوەو ئەکاتەوە کە بەو جۆرە شتانە دەسخەڕۆ نەبن و هەڵنەخەڵەتێن، "اياكم و خضراء الدمن، قيل يا رسول الله ﷺوما خضراء الدمن؟ قال المرأة الحسناء في المنبت السوء" الدار قطني.

مەبەست لەو ئاگادارو وریاکردنەوەیە، هەر زۆر گەورەو ئاشکرایە، هاوسەریی نابێت هۆیەك بێت بۆ بەدەستهێنانی ئەو جۆرە شتانە، حۆ ئەگەر وەها بوو، دیارە مەبەستە سەرەکیی و بنەڕەتییەکانی گوم ئەکات، ئەوەش لەگەڵ گیانی ئیسلامدا ناگونجێ.

ئاواز: بەڵام ئادەمیزاد بە سرووشت شەیداو سەرگەرمە بە جوانیی، حەزی لێئەکات، کە لە جوانییەوە دوور بێت وا

هەست ئەکا کە شتێکی سەرەکیی گوم کردووە، لە ناخی خۆیدا هەست بە بێبەسیی ئەکات، بەڵام کاتێ بووە خاوەنی ئەو جوانییەو بەدەستیهێنان دەروونی ئەحەسێتەوە، هەشت بە بەختیاریی ئەکات، سۆزی تێراو ئەبێت، ئیتر چۆن ئەبێ جوانیی حیسابی بۆ نەکرێت؟

دڵپاك: چاوەکەم، مەبەستم ئەوە نەبوو کە تۆ بۆی داچوویت، بەڵام پەلەت کرد، بەڵکو مەبەستم ئەوەبوو کە ئیسلام جوانیی ناکات بە بناغە، هەموو پایەو شتەکانی تری لەسەر دابمەزرێت و بیانکاتە قوربانی جوانییەکی دەمو چاو، یان لەش و لار، جوانیی بەشێکە، نەك هەموو شت، ئەگینا ئیسلام لایەنی جوانییش ڕەچاو ئەکات و حیسابیشی بۆ ئەکات، لە فەرموودەی سەحیحدا پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ "ان الله جمیل یحب الجمال" (فقه السنة).

سکاڵا: لە ڕاستیدا جوانی هەموو شتێك نییەو نابێ بکرێت بە پێوەری نرخی ئافرەت، بەڵام ئەی دەوڵەمەندیی و کەسوکارو پلەو چین و ئەوانە بۆچی؟

دڵپاك: خوشکەکەم، من نەمگوت کە ئیسلام هیچ جۆرە حیسابێك بۆ ئەو لایەنانە ناکات، بەڵکو گوتم، ئەوەندە گرنگیی پێنەداون، واتە نەیکردوون بە بەردی تەنیای بناغەی هاوسەرێتیی و تەنیا سەیری ئەوان بکرێت لە کاتی هاوسەر هەڵبژاردندا، ئەوەش بۆ ئەوەیە کە مەبەستی سەرەکیی لە ژنهێناندا نەخرێتە ناو یەکێك لەو لایەنە ماددییە دنیاییە، بۆ ئەوەی هاوسەریی نەبێتە هۆیەك بۆ بەدەستهێنانی یەکێك لەوانە، چونکە هاوسەریی پیرۆزەو لەوانە بەرزترە، ئایا ئەگەر پیاو لەبەر خاتری یەکێك لەوانە، ژنێك مارە بکات، دوایی ئەو شتە نەمێنێ، ئەو پیاوە بە هەمان چاو تەماشای ئەو ئافرەتە ئەکات کە کاتی خۆی تەماشای ئەکرد؟

سکاڵا: نەوەڵڵا، ها، ئێستا تێگەیشتم، خۆ قازانجی ئافرەتی تیایە، ئێ.. ئێ!

دڵپاك: ئەبێ ئەوەش بزانین، پیاوێك ئەگەر دەروونی ئەوەندە نزمبوو، چاوی بڕییە سامانی ژنەکەی، یان هەوەس پاڵی پێوەناو هەموو خەیاڵێکی خۆی ئاڵاند بە جوانیی لەشەوە، ئەو پیاوە تەواو نییە، دیارە هاوسەرەکەشی لە پەنایدا ناحەسێتەوەو تووشی بەدبەختیی ئەبێت، بۆیە پێغەمبەر ﷺ پیاوان ئەترسێنێ و ئەفەرمووێ: "من تزوج امرأة لمالها لم یزده الله الا فقرا، ومن تزوج امرأة لحسبها لم یزده الا دناءة.." (ابن جبان).

ئاواز: بەڵێ زانیمان کە ئیسلام هیچکام بە تەنیا لەو لایەنانە ناکات بە بەردی بناغەی هەڵبژاردنی هاوسەر، ئەی ئایا ڕێکدەکەوێت ئافرەتێك ئەو هەموو لایەنانەی تیابێت، بۆ ئەوەی هەڵبژێررێت بۆ هاوسەر؟

دڵپاك: پەنا بەخوا، من ئەوەم نەگوت، ئیسلام ئەوەی تیا نییە هەتا من بیڵێم!

ئاواز: باشە، ئەی چی ئەکەن بە بەردی بناغە بۆ ئەو مەبەستە؟

دڵپاك: دەی وا بڵێ، ئایین، کارچاکیی، ڕەوشت پاکیی، مرۆڤایەتیی ئەکەینە بەردی بناغە بۆ ئەو مەبەستە.

## لە هەر سەردەمێکدا چەکێك

سکاڵا: مامۆستا دڵپاك، لە ناو خەڵکدا هەندێ قسە سەبارەت بە ئافرەت بە شێوەیەکی بەربڵاو باون، وەك: لەناو قەلەڕەشکاندا چەند دانەی سپیی بەرچاو ئەکەوێت، لەناو خەڵکی بەهەشتیشا ئەوەندە ئافرەت ئەبینی، یاخۆ ئەڵێن حەیز جۆریکە لە غەزەب و قاری خوا کە هەر لەم دنیایەدا لێی گرتووە.. هتد. ئایا ئەوانە ڕاستن؟

دڵپاك: خوشکی بەڕێزم، ناحەزانی ئیسلام لە هەموو ڕوویەکەوە، بە هەموو شێوەیەك، هەوڵی ناشیرینکردنی ئیسلامیان داوە، دیارە ئەوەش پاشئەوەی کە بۆیان دەرکەوت بە جەنگی سەربازیی ناتوانن عەقیدەی خوایی لە دڵی مسوڵماندا ڕیشەکەن بکەن، بەڵێ هەر لە دەرکەوتنی ئیسلامەوە بۆ لەناوبردنی هەوڵدراوە، جا ناحەزان بە پێی کات و شوێن و ئاستی پلەی مسوڵمانان، بە تایبەتیی ئاستی پلەی ژیریی و ڕۆشنبیرییان لە هەموو کات و شوێنێکدا چەکی جەنگ و جۆری پڕوپاگەندەیان گۆڕیوەو ئەگۆڕن.

ئەو جۆرە پڕوپاگەندانە هی سەردەمێکبوون کە ئاستی ژیریی و پلەی ڕۆشنبیری خەڵك لەو کاتەدا ئەو جۆرە چەکەی ویستووە، تەنیا تواناى وەرگرتنی ئەو قسانە بووە، ئەوە جۆرە چەکێکی کۆنی باوەماوی کوفرە، دژ بە ئیسلامو وابزانم باوی نەماوەو فڕێدرایە ناو تەنەکەی زبڵی مێژووەوە، تۆی خوێندەوارو ڕۆشنبیر کەی ئێستا ئەبێ باوەڕ بە درۆو دەلەسەی وەها بکەیت!

ئاواز: دوور نییە ئەو قسانە ڕەنگو ڕیشەیەکیان هەبێت، چۆن؟

دڵپاك: ئەی نەمگوت چەکی جەنگی چەند سەردەمێکی ڕابردوو بوون بە دەست کوفرەوە؟، واتە خاوەن ڕەگو ڕیشە بوون، لەسەر زەمینەی قین لە دڵیی و دژایەتیی کردن لەگەڵ ئیسلامدا ڕوواون، با بگەڕێینەوە سەر ژیریی و ژیربێژیی و لە ژێر تیشکی قورئاندا ئەو قسانە شی بکەینەوە.

1. ئایا ئەو کەسانەی کە ئەو جۆرە قسانەیان تاشیوەو بڵاویانکردۆتەوە، خۆیان خاوەن باوەڕبوون؟ باوەڕیان بە بەهەشتو دۆزەخ بووە؟

2. بابڵێین . بە فەرزی مەحاڵ . خاوەن باوەڕبوون، دەی ئەو جۆرە قسانەیان لە چ سەرچاوەیەکەوە هەڵگۆزاوە؟ لە قورئانەوە؟ لە کردارو گوفتاری پێغەمبەرەوە؟ خۆیان لەلایەن خواوە نیگایان بۆ هات؟! کامیان لە بەهەشتدا گەڕایەوەو ئەو هەواڵەی هێناوە؟

3. ئێوە خۆتان خوێندەوارن و زۆر چاك ئەزانن حەیز چییەو چ کارێ لە ژیانی ئافرەتدا ئەبینێ، ئەگەر ئافرەتێکی نەزان و نەخوێندەوار باوەڕ بە (غەزەب و قاری) خوا بکات لە باسی حەیزدا، ڕەنگە ناهەقی نەبێ، چونکە نەزانە، نازانێ حەیزو گرنگیی حەیز چییە!، بەڵام ئێوە ی ڕۆشنبیر ئەبێ پەرچی ئەو خورافیاتانە بدەنەوە، ئەبێ گاڵتەتان بێت بەشتی وەها.

جا ئەگەر حەیز غەزەبو قاری خوا بێتو لە ئافرەتی گرتبێ، ئەبێ ڕیشو سمێڵو دەنگی زلو گڕیش، غەزەبو قاری خوابن، لەم دنیایەدا لە پیاوی گرتبێ! دە ی ئەویش ئایا ڕاستە؟، بەخێوکردن و سەرپەرشتیکردنی خێزان دراوە بەسەر پیاودا، ئەوەش وەك ئەزانن ئەوپەڕی ڕەحمەتو نارەحەتیی تیایە، کەوابێ ئەوەش غەزەبو قاری خوایەو هەر لەم دنیایەدا گرتوویەتی لە پیاو!.

ئێوە بێبەڵابن، زوو شتتان لەبیر ئەچێتەوە، من لە یادمە کە کاتی خۆی باسی شیاویی ئاییندارییمان کرد، بە درێژی باسمانکرد کە ئافرەتو پیاو وەك یەكو بەبێ جیاوازیی، شیاوی ئاییندارین، لە ڕۆژی دوایشدا پاداشتو سزایان وەك یەك بەستراوە بە کردەوەکانی دنیایانەوە، لەوەش زیاتر، نێرو مێ لە یەکترن و جیاناکرێنەوە، کەچی سەیرن.. سەیرا، فەرموودەی خواو پێغەمبەر ﷺ فەراموش ئەکەین، بەڵام قسەی خەڵك کە بەسەر پێیەکەوە ئەیبیستین لە مێشکماندا ڕەگ دائەکوتێ!، ئەها خوا ئەفەرمووێ (فَاسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لاَ أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى بَعْضُكُم مِّن بَعْضٍ) (آل عمران: 195). ئەی بە پێی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ بە هەشت لەژێر پێی کامیاندا بوو، (دایك) ئافرەت، یان (باوك) پیاودا؟.

سکاڵا: ئەوەیانم لە یادە، (الجنة تحت اقدام الأمهات).

دڵپاك: دەی ئێمە ئەبێ شوێن فەرموودەی خواو پێغەمبەر بکەوین، نەك قسەی ئەمو ئەو، کە بە ئارەزووی خۆیان بەدەست کیسەی کوفر ئەیانکەن، ئەو قسانە، کوفر خۆی چاك ئەزانێ باویان نەما، بۆیە دەستی لێهەڵگرتن و بەکارو نەخشەیەکی ترەوە پەشۆکاندوونی: سەربەستیی، ئازادیی، سەربەخۆیی، کارکردن بۆ ئافرەت، کارگە.. هتد. چەکی دەستی ئێستای کوفر ئەوانەن، خوا یاربێ ڕۆژێك دێت ئافرەت لەمانەش چاك تێئەگات.

# مرۆڤایەتیی لەجوانیی گرنگترە

سکاڵا: ئاواز بیڵێم؟ ئەڵێی چی؟ بیڵێم؟

دڵپاك: چییە؟ فەرموو بێلێ، هەرچییەکی گوتووە پێم گەردنی ئازاد بێت.

سکاڵا: ئەیگوت: ئەها ئیسلام گوێی لە جوانیی نییە، ئەبێ پیاوی مسوڵمان ژنەکەی ناشیرنو ژنەکەش مێردەکەی ناشیرین بێت، ئەوسا کۆمەڵگەی مسوڵمانان سەرپاك بریتییە لە ناشیرینەکان.

دڵپاك: ئای لەو مێشکە!، ئای لەو هۆشو بیرە!، خۆزگە لە هەموو باس و مەسەلەیەکدا ئاوا بیرت ئەکردەوەو بەدوای شتی ورددا ئەگەڕایت.

پێشەکیی دووبارەی ئەکەمەوە کە ئیسلام لایەنی جوانیی پێشێل ناکات، بەڵام ناشیکات بە تەنیا مەبەستی سەرەکیی و ئەنجامی ئەو جوانیی کردنە بە مەبەستی بنەڕەتیی بە چاك دانانێت، چونکە ئەگەر بکرێت بە مەبەست، ئەوسا ژنهێنان ئەبێت بە هۆیەك بۆ ئەو مەبەستە، دەی ئیسلام پێچەوانەی ئائەوەی بەلاوە ڕاستو دروستە، ئیسلام لە زەتپەرستیی نییە، مسوڵمان ئاژەڵ نییەو مرۆڤێکی پاکیی ڕاستەقینەیە، ژنهێنانیش بەلایەوە کارێکی سادەو هەڕەمەکیی نییە، بەزاقتر بیڵێم ئیسلام زادەی بیری ئەبیقورو ئەوان نییە، زادەی بیری ئەوانە نییە کە تۆوی ژیان لەناو پیسیو بۆگەندا ببینن، خوشکە ئاواز، ئەگەر ئیسلام بیگوتایە (ان العفونة هي معمل الحياة)، توخوا چیتان ئەگوت؟، چەند ئەو ڕستەیەتان گەورە ئەکرد؟!

ئاواز: ئەو ڕستە هەڵەو پیسە هی کێیە؟ هەڵبەت خۆی لەو کارگەیەدا چاوی تروکاوەو گوێی کردۆتەوە!، جا ئەوە قسەی بنیادەمە؟

دڵپاك: تەماشای پەڕاوی (المرأة في التراث الاشتراكي، ترجمة جورج طرابيش) لاپەڕە (27) بکە، ئەوسا ئەزانی هی کێیەو خۆیشت وەڵامی ئەو پرسیارانەت بدرەوەو ئەوسا ئەگەر بتەوێ ئەگەر تێبگەیت، تێئەگەیت.

نازانم بۆچی بە ورديی نەڕوانینە مەسەلەکە؟! لە کاتێکدا کە هاوسەریی یاسایەکی سرووشتیی بنەڕەتیی و گرنگەو هیچ گیانلەبەرێ ناتوانێ دەستی لێهەڵبگرێت، بۆچی بیترازێنینە ناو بازنەیەکی تەسکی جوانیی لەشەوە، یان سامانەوە، یاخۆ کەسو دەستو پلەوجاوە؟، ئەی بۆچی گرنگترین ڕەگەز ژێر پێ بخەین کە مرۆڤایەتییە؟ ئایا مرۆڤایەتیی لە مرۆڤدا شتێکی کەمە؟.

ئافرەت لە پێش هەموو شتێکدا مرۆڤە.. مرۆڤ! دەی ئەبێ مرۆڤایەتییەکەی لە پێش هەموو شتێکدا بێت، فەزڵی بەسەر هەموو شتێکدا بدرێت، ئەمجا لەو مرۆڤایەتییەوە تەماشای لایەنەکانی تری بکرێت، خۆ تاوس، ئاسك، دووگیانداری ڕەنگینو جوانن، ئەی بۆچی پیاو هەوڵ نەدات بۆ بەهاوسەرکردنی خۆی لەگەڵ ئەوانەدا، ئەگەر مەسەلە تەنیا جوانیی بێ؟.

جوانیی لەشو ڕووخسار بە تەنها بەس نییە، جوانیی ڕاستەقینەی پاك لە مرۆڤایەتییەوەیە، مرۆڤایەتیی پاکیش بە باوەڕو ئایین زاخاو ئەدرێو ئەتوانێ خۆی لە گوم نەبوون بپارێزێت، ڕەوشتیی بەرزو سیفاتی جوانو سرووشتی مرۆڤ بە باوەڕ بەخواو پەیڕەوییکردنی فەرمانەکانی ئەنەخشێن، هەر لەبەر ئەوەیە کە پێغەمبەری ئیسلام ﷺ فەزڵی ئایینداریی ئافرەتی داوە بەسەر لایەنەکانی تردا: (تنكح المرأة لأربع، لما لها، ولحسبها ولجمالها، ولدينها، فاظفر بذات الدين تربت يداك) (مسلم وبخاري).

ئاواز: لە ڕاستییدا، ئیسلام بە وردیی داچووە لە بابەتەکەدا، بەڵام باوەڕ بکە من ئەو قسەیەم لە ڕووی گاڵتەوە بە سکاڵا گوت.

سکاڵا: گاڵتەت بە خێر دەرچوو، ئەوەتا باسەکەمان بۆ ڕۆشنتر بووەوە، بۆمان دەرکەوت کە هاوسەریی نابێت لەسەر بنەڕەتی تەماعکاریی و لەزەتپەرستیی و چاوبڕینە سامانو دارایی و بە تەمابوونی هێزو پلەو شتی وەها دامەزرێ، بەڵکو

